

## نووسیـــنی
## مامۆستا کۆمەڵی ڕزگاربوو

لەبەرهەمەکانی دەزگای سوپا بۆ بڵاوکردنەوە

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ} .

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً}

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً} أما بعد:

## دەسپێك

خوا : بریتیە لەو سەرچاوەیەی کە مەنهەجی ژیانت لێ وەرگرتوە ، یاخود یەکێك لە عیبادەتەکانت بۆ ئەنجام داوە، جا ئەو خوایە خوای حەق بێت یان باطل.

خوای حەق : بریتیە لە الله کە تۆ و هەموو بونەوەری دروست کردوە هەموو گەردوون ئەو خاوەنێتی و رزقی ئەدا و بەریوەی ئەبات هەر ئەو خوایەیە کە تۆی ژیاندوە تۆش ئەمرێنێ و زیندووت ئەکاتەوە و بەهەشت و دۆزەخی بەدەستە و خاوەنی توانای ڕەهایە بەسەر هەموو شتێکدا ، کەواتە خوایەك خاوەنی ئەو هەموو گەورەییە و دەسەلاتە بێت ، هەر ئەو خوایەشە شایستەی ئەوەیە بپەرستریێ و گێڕایەڵی بکرێ بۆیە ئەو خوایە کە الله یە بەرنامەو ڕێباز و شەریعەتی بۆ داناوی کە ئیسلامە فەرمانیشی پێ کردووی هەموو عیبادەتەکان تەنها بۆ ئەو ئەنجام بدەی.

ناسری سوبحانی ئەفەرمێ : "هەر مەوجودێك نەیتوانی خالق بێت حەقییشی نیە(ئامر)بێت، دەبێت الله ئامر بێت کە خالقە، خۆی هەرشتێکی دروست کردوە بەپێی ئەندازەو کەیفیەتێکی دیاریکراو دروستی کردوە خۆی کێشەو گیروگرفتی ئەم موجوداتە دەزانێ، خۆی چۆنیتی بەریوەبردنیان دەزانێ،کەوابوو کەسی تر جگەلەو حەقی فەرمانڕەوایی نیە .کتیبی(سیاسەت و ئیسلام)

خوای ناحەق یش (باطل) : بریتیە لەهەموو ئەو ڕێچکەو ڕێباز و بەرنامەو عیبادەتانەی کە لەلایەن غەیری الله وە دانراوە و بۆی ئەنجام ئەدرێ و پەیرەوی لێ ئەکرێ، وەك"

١- (خوو ونەریتەکان) : کە زۆربەی کوفرە حەلال حەرام کردنی تیایەو حەرام حەلال کردنی تیایە گۆرینی حوکمی خوایە تیایە بەشتی تر کە بۆخۆی بۆتە خواو خەڵکیش ئەیپەرستی بەوەی کە جێ بەحێی ئەکات و بەناوی عەیبە لێی لانادات ئەڵێ عادەتە!!

٢- ( دەستوور ) : کە کتومت وەکو شەرع و دین وایە و نوسراوەتەوە ڕێوشوێن دیاری کردنی تیایە و حەلال و حەرام کردنی تیایە لە ژێر ناوی ڕێپێدان و قەدەغەکردن و سزادان و فەرزکردن ، بەبێ گەرانەوە بۆ شەرعی خواو وەرگرتن لێی

ئەوکەسانەی ئەو دەستورەیان نوسیوەتەوە و بەشداریان تیاکردوە لەنوسینەوەی ئەوا سیفەتی خوایان داوە بۆخۆیان بونەتە خوا چونکە تەنها ئەوە مافی الله یە ، ئەوانەشی دەنگیان بۆداوە : وەك ئەوە وایە بڵین دینی الله مان ناوێ ئەم دینە تازەیەمان ئەوێ و ئیعتیرافیان کردوە بەخوایەکی تر جگە لە الله کە ئەوانەن کە دەستورەیان نوسیوەتەوە.

٣- (یاسادانان) : كه ئەوەش خۆی له ئەنجومەنی نوینەران یاخود پەرلەمان كه دەبینیتەوه كەسەرەكیترین سیفەتی ئەندامەكانی بریتیه لەوەی مافی یاسادانانیان پیدراوه ، ئەوەشمان زانی كه مافی یاسادانان تەنها مافی الله یه كه داینـاوه له قورئان و سونەت و ئەفەرمیٚ (الا له الخلق والامر ) (ان الحكم الا لله)( ام لهم شركاء شرعوا لهم من الدين مالم يأذن به الله) (الله يحكم ولامعقب لحكمه) بەلام ئەو ئەندام پەرلەمانانه رازی نین الله بەتەنها ئەو مافەی هەبیٚ هەستاون خۆیان چواندوه به خواو ئەو مافەی خوایان له الله سەندۆتەوه بۆخۆیان دەستیان كردوه به ئەنجمدانی خوایەتی بەیاسادانان حەلال حەرام كردن و حەرام حەلال كردن و شت فەرزكردن و حوكم دەركردن هەر رۆژەو بەشێوەیەك به سزایەك سەرپێچیكارەكانی سزا ئەدەن ، ئەو خەڵكەشی دەنگی پێداون بەسی نەبوه تەنها الله خوای بیٚ بۆیه ئەو خواوەندانه هەڵبژاردوه بۆپۆستی خوایەتی كه له پەرستگای پەرلەمان پەیرەو ئەكریٚ.

٣ -(حیزب وبەرنامەكەی) : كه ئەویش شەریعەت و ریبازێك و بەرنامەیەكی بۆخۆی نوسیوه وەكو خوا پاشان بانگی خەلك ئەكات بۆ شوێنكەوتنی ئەو خەڵكەشی شوێنی كەوتون بونەته عەبدی بەبیٚ ئەوەی هەر گویٚ بدەنه شەریعەت و دینی خوا فەرمانی چیان پیٚ بكەن بەقسەی ئەكەن و خوێنی خۆشیان بۆ ئەرێژن وەكو ئاشكرایه بەشەو و بەرۆژ زیكری ئەكەن.

٥-(پەیمانی نەتەوه یەكگرتووەكان ) : كه ئەویش خوایەكه و كۆمەلیٚ قانون و یاسای دارشتوه دەولەتەكان و حیزب و لایەنەكان لەكاتی بوونی كێشەكان نێوانیان پەنای بۆ ئەبەن.

وەکو چۆن موسلمانان لەکاتی ناکۆکیان پەنا بۆ الله ئەبەن و ئەگەڕێنەوە بۆ دینەکەی
.خوای گەورە ئەفەرمێ :

(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا)

{وما كان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضى الله ورسوله أمرا أن يكون لهم الخيرة من أمرهم}

٥- ( مەحکەمەکان) :بریتیە لەوشوێنەی کە ئینسانە خواکان ئەو دین و بەرنامەیەی بۆخۆیان نوسیویانەتەوە لەوێ حوکمی پێ ئەکەن و کێشەکانیانی پێ چارەسەر ئەکەن و عەبدەکانیشیان ئەگەڕێننەوە بۆلای تاحوکمیان بکات کێشەکانیان چارەسەربکات ئیتر هەموویان ئەو دینە پەیرەو ئەکەن پاڵی لێ ئەدەنەوە.

٥- (خزمایەتی) : لای زۆربەی خەڵك خزمایەتیش بۆتە بتێك ئەپەرسترێ بەو مانایەی مادام خزمە و لە نەوە پشت و کەسی منە ئیتر خۆشیم ئەوێ و سەری ئەخەم هەرچەندە کافریش بی کێشە نیە هەر هاتوچۆی ئەکەم ڕیزی ئەگرم مافی هەیە و پەیوەندی لەگەل نابچرم مادام خزمە قەت پشتی بەرنادەم و پێم ناخۆشە فلانە کەسم هەرچەندە کافریش بێ قسەی پێ بوترێ بەناشرین باسبکرێ.

٧- (بیری نەتەوایەتی) : ئەویش خوایەکی ترەو زۆر ئەیپەرستن وەك کوردایەتی یان عەرەبایەتی یان تورکایەتی..بۆ نموونە تۆ کوردی ئیتر واجبیان کردوە ئەبێ کوردت خۆشبوێ لەبەر ئەوەی کوردە جا ئەو کوردە لەسەر دینی حەقە یان نا موسلمانە یان کافرە الله ئەپەرستێ یان شەیتان بەئەخلاقە یان بێ ئەخلاق زالمە یان دادپەروەر

ئەوانە گرنگ نیە مادام کوردە ئیتر هەموو مافێکی هەیە ئەبێ بەرگری لێبکەی وسەریبخەی وە ئەشبێ رقت لەغەیری کورد ببیتەوە لەبەرئەوەی کە کورد نیە جا خوایە کرد باشترین دینی ئەبوو باشترین رەوشت و چاکەی ئەبوو نابێت خۆشیت بوێ و سەریبخەی و بەرگری لێ بکەی مادام لەگەل کوردێکدا کێشەی هەیە ئەگەرچی کوردەکەش ستەمکاربووبێ!!!

٩- (بیری نیشتیمانی) :واتە تۆ نیشتیمانەکەت خۆشبوێ لەبەرئەوەی تیایدا لەدایك بویتە ئەبێت لە پیناو ئەو نیشتیمانەشدا گیان و مالت بکەیتە قوربانی وە هەموو مافێکیشت هەیە مادام تۆ خەڵکی ئەو نیشتیمانەی ئەبێ نیشتیمانەکەت لەسەرووی هەمووشتێکەوە بێو بەپیرۆزی بزانی و سوێندی پێ بخۆی بەهۆیەوە رق و دۆستایەتی دروست بکەی. ئەم یاسایەش خواوەندە ئینسانەکان دایانناوە و کردویانە بەبتێك ئەپەرستری لە ولاتی ئیمە.

بەلام لە ئیسلامدا نیشتیمان: بریتیە لە هەموو زەوی چونکە هەموو زەوی تەنها الله دروستی کردوە و تەنها الله خاوەنێتی وە تەنها الله مافی ئەوەی هەیە پێت بلێ چۆن مامەلە بکە لەگەل ئەو شوێنەدا کە لێی لەدایك بووی بۆیە نیشتیمانی موسلمان ئەو شوێنە نیە کەتیایدا لەدایك بوە بەڵکو ئەو شوینەیە کە بەرنامەی خوای پەروەردگاری تێدا تەتبیق ئەکرێ بۆیە کاتێك خوای گەورە فەرمانت پێ ئەکات ئەو شوینە ی کە لێی لەدایك بووی حاشای لێ بکەی و بەجێی بێڵێ کاتێك نەتوانی و دینکەی خوای تێدا بەرقەرار بکەی بۆیە واجبە کۆچ بکەی بۆ ئەو شوێنەی کە دینی خوای تێدا تەتبیق ئەکرێ ئائەوە نیشتیمانی تۆیە نەك نیشتیمانێك کەکوفر داگیری کردوە و بۆگەنی کردوە ناهێڵن خوای حەقی تیابپەرستری بە تەواوی.

١٠ -(سنوری ولاتان سایکسبیکۆ) :جاران خاکی موسلمانان کە نیوەی سەرزەوی زیاتری گرتبۆوە تەنها یەك ولات بوو یەك دەولەت بوو چونکە هەمووی یەك خەلیفە و یەك بەرنامە بەریوەی ئەبرد کە دینی خوابوو بەلام کاتێ داگیرکەران هاتن پارچەپارچەیان کردوو هەر بەشەیان بەخشی بەیەکێك لە بەکرێگیراوەکان خۆیان سنوریان بۆکێشاو ئالای رەگەزپەرستی و نەتەوایەتی نیشتمان پەرستیان پێدا تابوە نەخۆشیەکی کوشندە هەموو موسلمانانی گرتەوە دینەکەی خۆیانی لەبیربردەوە هەستان خۆشەویست و رق یان لەسەر ولات دروست کرد هەر کەسێك لە ولاتەکەی ئەو بوایە برای بوو دۆستی بوو ستەمی لێ بکرایە بەدەنگیەوە ئەچوو ، براکەی تریشی کەکەوتبوە ولاتێکی ترەوە حاشای لێ کردبوو هەرچەن ستەمیللێبکرایە بەدەنگیەوە ناچوو چونکە لەسنوری ولاتەکەی ئەو نەبوو ئابەم جۆرە ئەم سنورانەش کراوەتە بتێك و ئەپەرسترێ دووبەرەکی ئاژاوە و خوێن رشتن کەوتۆتە نیوان خەڵکەوە بەهۆی ئەم سنورانە.

١١- (ئالای ولات یاخود حیزب) : کە پێناسەیە بۆ بەرنامەو رێباز و یاساو دینی ئەو ولات و حیزبە بۆیە خەلکیش وەکو ئاژەل بێ ئەوەی بیربکاتەوە ئەیپەرستێ بەوەی زۆرجار لەبەری هەلەسێ بەگەورەی ئەزانێ بە پیرۆزی ئە دا ئەنات بە خەتی سوور ناوی ئەبات بینیومانە سوجدەی بۆ ئەبات لەسەری خۆی بەکوشت ئەدات بەرزی ئەکاتەوە خۆشەویستی و رقایەتی لەسەر دروست ئەکات کە خواوەندەکانی ئەم بتەیان بۆکێشاوە ، ئەشڵێت موسڵمانم وەرە شێت مەبە!!!

١٢- (حەسەن و حوسێن و فاطمة و عباس عبدالقادر گەیلانی واحمد البدوی مەزارگەکان ....) : ئەمانە پیاوچاك و ئەولیای خوان بەڵام خەلکانێکی موشریکی نەفام هەستاون کردویاننەتە بتێك بەشێك لە عیبادەتیان بۆ ئەنجام ئەدەن کە تەنها ئەو عیبادەتانە بۆ خوا ئەبێ بکرێ وەکو تەواف کردن بەدەوری مەزار و قەبرەکانیان و قوربانی نەزر بۆ کردنیان وداوالێ کردنیان و بڕوابوونی بەوەی شیفایان ئەدەن و پیرۆزن خۆسواندن پێیان ترسان لێیان و پشتبەستن پێیان وسوێند پێ خواردنیان بەگەورە دانانیان ..هتد تاکو تکایان بۆبکەن لای خوا یان لە موصیبەتێك ڕزگاریان بکەن کە هەمووی کوفرە.

١٣- (عیسی ی کوری مەریەم علیە سلام) : کە پێغەمبەر و خۆشەویستی خوایە کە نەصرانیەکان وێنەکەی خۆی و دایکیان کردۆتە بتێك و ئەیپەرستن و داوای لێ ئەکەن بۆ ئەوەی تکایان بۆ بکات لای خوا وە ئەیکەنە کوڕی خوا پەنا بەخوا پاك و بێگەردی بۆ خوا.

١٤- ( زانا و عابیدەکان) : کە هەرشتێ فلانە مەلا بیلێ ئیتر تەواوە و ئەوە دینی حەقە مادام ئەلێ من شوێنکەوتەی قورئان و سونەتم یان من وام وام مادام ریشی درێژە و شەروالەکەی کورتە یان سەربە فلانە تەریقەتەیە فلانە شێخەیە یان فلانە زانا بەباشی زانیوە ئیتر تەواو من ئەیکەمە موفتی خۆم ئەو چی بلێ من ئەوە ئەکەم ئەوە تەواوە تاقەتم نیە بەدوای شتی ترا بگەڕێم ئەوەشت کردۆتە خوا چونکە ڕەنگە ئەوکەسە خۆی بۆخۆی کافربێ سەربەلایەنێکی کوفری بێ موشریك بێ یان سۆفی بێ یان تەوحید هەر نەزانێ چی یە خۆ هەرچی ئەوبلێ حەرامە و قەدەغەیە یان حەلالە ودروستە ئەوە حەق بێت و ڕاست بێت ئەوە کردوتەتە خوا خۆ ئەو مەعصووم نیە لەهەلە خۆ ئەو پێغەمبەر نیە خۆ پێغەمبەر و خوا نەیانوتوە شوێن فلانە کەس بکەون بەڵکو فەرزە لەسەرت شوێنی دینی خوا بکەوی کە قورئان وسونەتە هیچ بیروباوەڕهەڵەنگەری

تانەزانی بەبەلگەی قورئان وسونەت تەواوە یان ناتەواوە هیچ قسەو کردارێك نەکەی تا نەزانی بەلگەی لەسەرە لە قورئان وسونەت یان نا ، گوێ لەم رووداوە بگرە ،

..وفی حديث عدی بن حاتم وهو حديث حسن طويل رواه أحمد والترمذی وغيرهما وكان قد قدم علی النبی صلی الله عليه وسلم وهو نصرانی فسمعه يقرأ هذه الآية قال فقلت له أنا لسنا نعبدهم قال أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه ويحلون ما حرم الله فتحلونه قال فقلت بلی قال فتلك عبادتهم.وفی الرواية قال لعدي بن حاتم في تفسير قوله تعالی: اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ

أما إنهم لم يعبدوهم ، ولكنهم أحلوا لهم الحرام فأطاعوهم، وحرموا عليهم الحلال فاتبعوهم أخرجه الترمذي (3095/5) وأحمد من طرق، وهو حديث حسن أ.هـ

واتە : عەدی کوری حاتەم ئەفەرمێ : هاتم بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم صەلیبیکم لەمل بوو لە ئالتوون پێی فەرمووم : ئە بـتە لێ کەرەوە لەملت ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە { اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله } واتە زاناو عابیدەکانی خۆیان کردونەتە خواوەند لەگەل خوایە ، عەدیش ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەوانمان نەکردۆتە خوا ، پێغەمبەریش فەرمووی : ئەی ئەوە نیە حەلالتان بۆ حەرام ئەکەن و حەرامتان بۆ حەلال ئەکەن ئێوەش بەقسەیان ئەکەن ئائەوە عیبادەت کردنەکتانە بۆیان کە بونەتە خواتان.

ئێستا زانیمان بەلاوە ئەم هەموو بت و خوایە لەناومان بەتایبەتی سەر زەوی بەگشتی وە زانیشمان الله ش خوایەکە لە نێو هەموو ئەم خوایانە کە خەلکی لەگەل هەموو خوایەکانی تری ئەویش ئەپەرستێ ، زۆر جار کەسی وا هەیە چەن خوایەك ئەپەرستێ لەیەك کاتدا ، وە ئینسان نابێتە موسلمان هەتا نەزانێ چۆن الله بەتەنها بگرێ لە هەموو بوارەکانی عیبادەت و شوێن کەوتن و ملکەچ بوون و حوکم پاشان بەرائەت و بێباوەری خۆی بکات لەهەموو دژەکانی.

بۆیە ئەبێ سەرەتا کافربی و بێباوەربی بە هەموو ئەو خوایە باطلانەی کە طاغووتن جگە لە پێغەبمەران و پیاوچاکان کە بەوە رازی نەبونە کە بپەرسترین بۆیە پێیان ناوترێ طاغوت بەلکو طاغوت ئەو کەسەیە کە رازیە بەوەی تایبەتیەکی الله بدرێ بەو یان پەرستنێکی بۆبکرێ یان شوێنی بکەوترێ و گوێرایەڵی بکرێ لەسەرغەیری دینی خوا ئەوە طاغوتە لەسەرەوە باسمان کرد ئینجا دوژمنایەتیان بکەی و رقت لێیان ببتەوە ئاشکرای بکەی و خۆتی لێ بەدووربگری و ئەو خوایانەو شوێنەکەتوانی کافر بکەی ئینجا بێیت ئیمان بێنی بە الله بەوەی تەنها مەنهەجی ژیانت لە لە الله وەربگری و هەموو عیبادەتەکان هەر بۆ ئەو ئەنجام بدەی ، ئەم مانایەش خوای گەورە لە ژێر رۆشنایی ئەم ئایەتە بۆمانی روون کردۆتەوە

﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لا انفِصَامَ لَهَا ﴾ [البقرة: 256]،

واتە : ئەو کەسەی کافرببێ بە تاغووت و پاشان ئیمان بێنی بەخوا ئائەوە دەستی گرتوە بە گرێی ئیسلام و لاالە الا الله کە بچرانی بۆنیە . بۆیە ئەبینی سەرەتا مەرجی کردوە لەسەرت کوفربکەی بەتاغووت کە مەرجە ئینجا قبولە ئیمان بێنی بەخوا بۆیە ئەوەی ئەو مەرجەی تیانەبێ هێشتا نەیوتوە لا الە الا الله هەرچەن رۆژانە هەزارجار دوبارەی بکاتەوە، وە خوای گەورە لە ئایەتێکی تریشدا بۆمان روون ئەکاتەوە کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ ئەوە ناردوە کە بەخەلك رابگەیەنن خۆیان بەهەموو شێوەیەك دووربگرن لەتاغووت و عیبادەتی الله بکەن

وەك ئەفەرمێ

(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ۖ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ ۚ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ)

وە پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی (من قال "لا إله إلا الله"، وكفر بما يعبد من دون الله؛ حرم ماله، ودمه، وحسابه على الله).

واتە :هەر كەس بڵی لا اله الا الله ( هەرئەوەنە بەس نیە)پاشان كافروبێباوەربێ بەوەی ئەپەرستێ و پەرستنی بۆ ئەكرێ جگە لە الله ئائەوكاتە خوێن و ماڵی ئەپارێزرێ ناودڵیشی لەسەرخوایە ئێمە نایزانین.

بۆیە كاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم **13** ساڵ لە مەككە بانگەوازی ئەكرد بۆ لا اله الا الله هەر وشەیەك نەبوو بیڵێن و تەواو ئیتر رزگاریان بێ نانەخێر بەڵكو ئەیانزانی مانای چی یە ئەو ووشەیە و داوای چییان لێ ئەكات ئەو ووشەیە چونكە قورئان بەزمانی ئەوان دائەبەزی . مانای ئەوەی ئەدا كە بابوباپیرانیان بەكافرو بە گومرا بزانن حاشا بكەن ولەدینەی كەلەسەری بوونە و وازبێنن لەو عادەت و یاسا ورێسایانەی كە لەنێوان هۆزەكاندا بۆخۆیان دایانرشتبوو بە ئارەزووی خۆیان حەلال و حەرامیان ئەكرد لە پەرلەمانەكەی خۆیان كەناوی دار الندوة بووو بۆیە ئەیانزانی ئەو ووشەیە مانای چی یە بۆیە نەیان ئەوت هەر وەك خوای گەورە بۆمانی تۆماركردوە باسیان ئەكات و ئەفەرمێ

( أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ (5) وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ (6)...)سورة ص

واتە : ئەوە چی یە موحەممەد ئەیەوی خوایەكانمان تەنها بەكەین بەیەك خوا تەنها شوێن یەك رێباز بكەوین تەنها شوێن یەك حوكم بكەوین تەنها عیبادەت بۆیەك خوا ئەنجام بدەین بەراستی ئەمە شتێ سەیرە!!بڵاوەیان لێ كرد وتیان گوێی پێ مەدەن بەردەوام بن لەسەر دین و حوكمەكەتان ئەوە هەر قسەیەكەو ئەیكات مەبەستێكی هەیە پەیوەندی بەخواوە نیە.

بشزانن قورەیش بڕوایان بەخوا هەبوو وە حەجیشیان ئەکرد و قوربانیشیان ئەنجام ئەداو خزمەتی حاجیانیان ئەکرد و خواردن ئاویان ئەدان ڕێزێکی زۆریان لەکەعبە ئەگرت و سوێندیشیان بە الله ئەخوارد بڕوایان وابوو تەنها الله خالق و رازقە و تەنها الله یە ئەیانژێنێ و ئەیانمرێنێ و تەنها الله بونەوەر بەرێوە ئەبات وەك خوای گەورە باسی حالیان بۆمان ئەكات و ئەفەرمێ ( ولئن سألتهم من خلق السماوات والأرض ليقولن الله قل الحمد لله بل أكثرهم لا يعلمون ( 25 ) و وە هەرکەسێك پەنای بۆ کەعبە ببردایە دەستیان لێ نادا ئەوەنە پیرۆزبوو لایان لەچەن مانگەی حەج شەریان ناکرد و بەرگرییان لەستەملێکراو ڕێزی زۆری میوانیان ئەگرت ئازایەتی سیفەتیان بوو دوای ئەوەش بەلکو مامەی پیغەمبەرصل الله علیه وسلم ابو طالب بەرگریەکی زۆری لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەکرد ئەیپاراست نەك هەر ئەو باپیریشی کەچی بەو هەموو عیبادەت و سیفەتە جوانانە هەر بە موسڵمان حیساب نەبوون موشریك بوون چونکە هەموو عیبادەتەكان و بەرنامەی ژیانیان لە الله وەرنەگرتبوو بەتەنها ملکەچ نەبوون بۆی بۆیە خوای گەورە سورەتی کافرونی دابەزان کە بەئاشکرا پێغەمبەر و هاوەلاکانی هەستن بەکافردانانی قەومەکەی خۆیان و تەبەرایان لێ بکەن و لەودینەشی کەلەسەرین و بانگی خەلکیش بکەن بۆ دینی یەکتا پەرستی الله ، لەبەر ئەوە بوو هەستان سەرانی کوفری قورەیش هەستان بەپیلان گیران بۆ سەرکردەی موسلمانان موحمەدا موستەفا بە زیندانی کردنی بێ یان کوشتنی یان دەرکردنی بەهەمانشێوەش چەشتیان بەهاوەلاکانی ناخۆشترین و بەئیشترین سزا دەروونی و جەستەیی و ئابووری.

ئێستا بۆمان دەرکەوت یانی چی ئیسلام یانی چی لا اله الا الله کە ئەو خەڵکە هەربەناو لەسەرین کە وەکو عادەت وەریانگرتوە و هیچی لێ نازانن تەنها ناوەکەی نەبێ بۆیە هەوڵ بدەن ئەم تەوحیدە بەلاوبکەنەوە زیاتر فیری بن و خزم کەس وکار و دەوروبەرتانی لێ ئاگاداربکەنەوە بیش ئەوەی بمرن و کارلەکار بترازێ ئەوکاتە پەشیمانی و گەرانەوە نیە کەسیش عوزری نیە چونکە قورئان و سونەت بەڵگەن و لەناومانن بەلام کەم کەس هەیە رووی تێ بکات و فێری بێت.

